پەیامەکانی حەق و نوور
پەیامی سێیەم

# فیتنەکانی ڕۆژگار

















نوسینی
شێخ عەباس فازل حەسەنی

وەرگێران و تەخریجاتی
مەلا ڕەزوان ناسراو بریندارى شاعر







پەیامەکانی حەق و نوور

پەیامی سێیەم

# فیتنەکانی ڕۆژگار

نوسینی

شێخ عەباس فازڵ حەسەنی

وەرگێڕان و تەخریجاتی

مەلا ڕەزوان ناسراو بریینداری شاعر

# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد العارفين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه الى يوم الدين.

أَمَّا بَعْدُ :

فیتنەکانی ڕۆژگار ئیمڕۆکە گشت ماڵێکی ئەم سەرزەمینەی گرتووەتەوە، ئەمەش بەهۆی پیلانی کافرەکان و مونافیقە پیسە شەڕانگێزەکانی ئەم سەردەمە، هەر بۆیەش لەبەر گرینگی بابەتەکە، جەنابی شێخ عەباس خوای گەورە بیپارێزی وەك ڕابەرێکی ئایینی، هەستاوە بە باس کردنی هەندێك لەو فیتنانە، وە چارەسەرییەکەشی لە قورئان و فەرموودەوە دەرمان ڕێژکردوە، بۆ ڕزگاری موسڵمانان لە هەر دوو جیهان، جا بەڕێزیان لە دوو پەیامی جیاواز نوسیویەتی لەژێر ناوی (الحَربُ عَلى القِيَمِ غَضَبُ الله)، وە (فِتْنَةُ الزَّمَان)، ئێمەش پێمان باش بوو کۆی بکەینەوە و بیکەینە نامیلکەیەك بۆ خوێنەری کورد زوبان.

"خوێنەری بەڕێز"

* هەستاوم بەتەخریج کردنی هەموو ئەو فەموودانەی کە جەنابی شێخ هێناویەتی، وە حوکمی فەرموودەکان لە ڕوانگەی شەرعەوە گشتیانم لە پەراوێزا نوسیوە.

* هــەر کاتێــك لـــە پـــەراوێزا ئـــەم نوســـینەت بـــینی بوغوونە(ب١/ل٤٥/ژ٤٦٥) مەبەستم بەرگی کتێبەکەو لاپەڕەی کتێبەکەو ژمارەی فەرموودەکەیە کە لەو کتێبەم نەقلّ کردوە.

* هەرکاتێك ئەمەت بینی (د٧٦٥هـ_و٨١٥هـ) ئەوە مەبەستم سالّی لە دایکبوون و وەفاتی ئەو کەسەیە بەسالّی کۆچی.

* هەندێك شتم زیاد کردووە کـە لــە عەرەبیەکـەدا نـەبوو، وامان پێ باش بوو، ئەمەش لەبەر گرینگی ئەو شتانە.

* وە ئەگەر لە پەراوێز بوخـاری و موسـلمت بـینی یـاخود بەتەنیا یەکێکیان بێ شەك فەرموودەکە وەرگرە، چونکە ئوممەتی ئیسلام لەسەر صەحیحی فەرموودەکان یەکـدەنگن، بـەلاّم بـۆ ئەوەکانی تریش ئەوە گەڕاومەتەوە بۆ بۆچوونی زاناکان لەسەر فەرموودەکان.




مەلا ڕەزوان ناسراو بریندارى شاعر
١٤٣٨/١/٢٦ کۆچی
٢٠١٦/١٠/٢٧ زاینی

## هێرشکردنە سەر ڕەوشت، تووڕەبوونی خوایە(ﷻ).

الحمد لله الذي هدانا لدين الإسلام، وفَضَّلَ دِينَنا على سائر الأدْيان، مَنْ تَمَسَّكَ بِهِ حَفِظَهُ اللهُ في الدنيا والآخِرة، وَوَفَّقَهُ لِسُمُوِّ الآداب، وصَلاح الأحْوال، والصّلاة والسّلام على المبعوثِ رحمةً للعالمين، الذي جاء فأصْلَحَ الأخلاق، ونَشَرَ الحقَّ والأنوار، وعلى آله وأصحابه، وتابعيهم بإحسانٍ إلى يومَ التَّناد.

أمّا بعدُ:

"خۆشەویستان" خوای گەورە(ﷻ) ئەفەرموویت: ﴿وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾[1] واتە: ئێمە ستەممان لەوان نەکرد، بەڵکو ئەوان بۆ خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، ئەمەش بەهۆی کوفر کردنیان و بەدرۆخستنەوەیان، لەسەر ئەو هەموو بەخشش و چاکانەی کە خوای گەورە(ﷻ) لەگەڵی کردبوون، ئەویش بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ڕاستگۆی ئەمین(ﷺ)، وە هەروەها بەهۆی دەرچوونیان لە فەرمانەکانی خوای گەورە(ﷻ) بۆ ئەم دینە پیرۆزە، لە سەرەنجام خوای گەورە جل و پۆشاکی برسیەتی پێ لەبەر کردن و تاڵی برسیەتی پێ چەشتن، ئەمەش دژی ئەو ژیانە خۆش و ڕەفاهیەتە بوو کە ئەوان پێشتر لەسەری بوون، وە هەروەها ترس و دڵە ڕاوکێی خستە نێویان، کە دژی

---

[1] سورة النحل آية ١١٨.

ئەو ئارامی و ئاسایشە بوو کە پێشتر تیایدا ئەژیان، هەروەکوو خوای گەورە(ﷻ) ئەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِىٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ﴾[٢]، واتە: هەر ئەو خوایەیە کە ئەوانی لەبرسیەتی ڕزگارکرد و خۆراکی پێ بەخشین، وە هەروەها لە ترس و دڵە ڕاوکێی دزو جەردەکان ئەمینی کردن و پاراستنیانی بۆ ئەوەی بازرگانیەکانیان بەسەلامەتی ئەنجام بدەن. ئینجا خوای گەورە جۆرەها دەرد و بەڵاو ناخۆشی بەسەردا زاڵ کردن کە لەمەو پێش نەیان بوو، ئەمەش بەهۆی کارە ناشیرینەکانیان و بێ باوەڕیەکەیان، وە بەهۆی ناسوپاس گوزارییەکانیان بە نیعمەتەکانی خوای گەورە. ئەوەتە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموویێت: (يَامَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ، لَمْ تَظْهَرْالْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطٍّ حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا إِلا فَشَا فِيهِمْ الطَّاعُونُ وَالأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلافِهِمْ الَّذِينَ مَضَوْا، وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِلا أُخِذُوا بِالسِّنِينَ وَشِدَّةِ الْمَئُونَةِ وَجَوْرِ السُّلْطَان عَلَيْهِمْ وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ إِلا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنْ السَّمَاءِ، وَلَوْلا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا، وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللَّهِ وَعَهْدَ رَسُولِهِ إِلا سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَخَذُوا بَعْضَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَيَتَخَيَّرُوا مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلا جَعَلَ اللَّهُ بَأْسَهُمْ

[٢] سورة القريش آية ٤.

بَيْنَهُمْ)[٣]، واتە: ئەی كۆمەڵی موهاجیرەكان، پێنج سیفەت هەن، ئەگەر ئێوە گیرۆدەی بن و تاقی بكرێنەوە پێی، وە پەنا ئەگرم بەخوا كە توشتان بێت: زینا لەناو هیچ گەلێك دەرنەكەوتووە تاوەكوو ئەو كاتەی كە ئاشكرایان كردووە، مەگەر الا نەخۆشی طاعون و برسیەتی لەناویاندا بلاّو بووەتەوە، كە لەمەو پێش پێشیەنەكانیان نەیان بینی بێت و بەسەریان دا نەهاتیێ.

وە كێشانەكانیان كەم نەكردەوە لەپێوانەو تەرازودا تائەو كاتەی دەستیان بەكەم كردنەوە كرد، بۆیە الا چەند ساڵانێك ئەوانیان گرتن و توشی گرانیان كردن، وە لەگەڵ زۆری پێویستیشیان بەیارمەتی كەچی یارمەتیان بۆ نەهات، وە سەرەڕای ئەمانەش زۆرداری سەركردەكانیش بێزارو ماڵ وێرانی كردن، بەهۆی باج و بەرتیل و پارە زەوت كردنەوە.

وە لەزەكاتدانی ماڵەكانیان بەردەوام بوون، تا ئەو كاتەی دەستی خۆیان لێ گرتەوە، بۆیە دلۆپە ئاوی ئاسمانیان لێ غەدەغە كرا، ئەگەر لەبەر ئاژەڵەكان نەبوایە باران نەدەباری بەسەریاندا.

---

[٣] صەحیحە. حاكم لە (مستدرك حاكم)(ژ٨٦٢٣). وە بەززار لە (مسند البزار)(ژ٦١٧٥). وە تەبەڕانی لە(مسند الشامیین)(ژ١٥٥٨) ، لە عەتای كوڕی ڕەباحەوە ڕیوایەتیان كردووە، ئەویش بەرزی كردۆتەوە بۆ ئیبن و عومەر (ﷺ)، حاكم ئەفەرمووێت: "صەحیحە"، وە زەهەبیش موافیقە لەسەری. ئەلبانیش بە صەحیحی داناوە بڕوانە: (صحيح الجامع الصغير)(ژ٧٩٧٥).

وە لەسەر پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەیان بەردەوام بوون هەتاوەکوو شکاندیان، ئەو کاتەش خوای گەورە دوژمنێکی لەغەیری خۆیانیانی بەسەردا زاڵ کردن، وە هەندێك لەو ماڵ و سامانەی کە لەبەر دەستیان بوو بۆ خۆیان بردیان.

وە سەرکردەکانیان بە یاسای خوای گەورە حوکمیان نەکردبێت و بە ئارەزووی خۆیان لە وەی کە خوای گەورە دایبەزاندوە هەڵبژێرن، الا خوای گەورە ناخۆشی و نەهامەتی داوێتە نێوانیان واتە: لەنێوخۆیاندا[٤]. الله أكبر ئایا بەرێزان ئەوە واقعی ئێستاکەی ئوممەتەکەمان نیە؟ ڕوون و ئاشکرایە لە هەموو ئەو شتانەی کەباسی لێوەکرا، پیت بۆ پیت.

وە هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (يَكُونُ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ)[٥] واتە : (لەناو ئوممەتەکەی مندا سزای

---

[٤] سبحان الله سزاكان ئێمەشی گرتووەتەوە، هەموو ئەو سزایانەی کە باسی لێوە کراوە وا بەچاوی خۆمان ئەیبینین، بژی دۆزەخ بۆستەمکاران. وەرگێڕ

[٥] صەحیحە. ترمذی لە (سنن الترمذي)(ژ٢١٥٢). وە ئیبن و ماجە لە (سنن إبن ماجه)(ژ٤٠٦٢). وە ئیبن وحبان لە (صحيح إبن حبان)(ژ٦٧٥٩). وە ئیمام ئەحمەد لە (مسند أحمد)(ژ٦٥٢١). وە حاکم لە (مستدرك حاكم)(ژ٨٣٧٦) لە ئیبن و عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە. ترمزی ئەفەرمووێت: "فەرموودەیەکی حەسەن و صەحیح و غەریبە". وە ئەحمەد محمد شاکر ئەفەرمووێت: "سەنەدەکەی صەحیحە". وە حاکم لە (مستدرك حاكم)(ژ٨٣٧٦) ئەفەرمووێت: "صەحیحە لەسەر شەرتی موسلم"، زەهەبیش موافقە لەسەری. وە ئەلبانیش بە صەحیحی داناوە، بڕوانە (صحيح الترمذي)(ژ١٧٤٨).

**ڕۆچوون بەناو خاك و گۆڕینی شێوە و هاویشتن ڕوو دەدات)، مەلا عەلی قاری[٦] ئەفەرمووێت: وشەی (خَسْفٌ) واتە: ڕۆچوون بەناو خاکدا، وە بەواتای ڕەش بوونی لاشەش گوتراوە چونکە وەرگیراوە لە (خُسُوفُ الْقَمَر) مانگ گیران ، وە (مَسْخٌ) گۆڕینی شێوە بۆ شێوەیەکی ناشیرین وەکوو مەیمون و بەراز کەبەر قەومی داود و عیسا کەوت (عليهما السلام)، وە (قَذْفٌ) بە مانای بەرد بارین لەئاسمانەوە، وە لە ئیمامی طیبی یەوە(رحمه الله)[٧] نەقلی**

[٦] عەللامە شێخ نور الدین عەلی کوڕی سولّتان محمدی قاری هەرەوی پاشان مەککی حەنەفی صۆفیە، بەناوبانگە بە (مەلا عەلی قاری)، مێژووی لە دایك بوونی دیار نیە بەلاّم لە هیرات لە دایك بووە، وە لە مەککەی پیرۆزیش کۆچی دوایی کردووە(١٠١٤ﻫ)، یەکێکە لە زانا لێکۆڵەرە هەرە بەرزەکانی ئیسلام، وە سەرچاوەیەکی گرینگە بۆ گەڕانەوە بۆ وتەکانی ئەم زانا بەڕێزە، چونکە متمانە پێکراوە لە لایەن زاناکن. وە لە دوای خۆشی کتێبێکی زۆری بەجێ هێشتووە کە ئەگاتە ٣٣٠ کتێب هەروەکوو نەوەکانی لەمەککەی پیرۆز فەرموویتیان. بڕوانە: (شرح مشكاة المصابيح)(ب١/ل١٦مقدمة ترجمة ملا على قاري) طبعة دار الكتب العلمية.

[٧] عەللامەو حافیزو ڕاڤەوان حوسێنی کوڕی عبد الله کوڕی محمدی طیبی تەبرێزییە، خەڵکی تەبرێزی کوردستانی ئێران، ساڵی لە دایك بوونی دیار نیە، وە فاتیشی (و٧٤٣ﻫ)، یەکێکە لە زانا هەرە بەرزەکانی ئیسلام، چەندین کتێبی هەیە بەناوبانگترینیان (حاشية الطيبي على الكشاف للإمام الزمشخري) بڕوانە: (فتوح الغيب فى كشف عن قناع الريب)(ب١/ل١٠٨).

کردووە کەوا ئەفەرموویێت: جۆری تریش لــە خـۆ هەلێـئـەگریێ واتە: (ئەم هاویشتنە)[٨].

"خۆشەویستان"

ئەگەر بەوردی سەیری ڕاڤەی فەرموودەکە بکەین، ئیمڕۆکە بەچاوی خۆمان ئەیبینین، بۆ نموونە تەیارەو صارۆخەکان و چەکەکانی تر هەمووی لە ئاسمانەوە بەسەر ئەم ئوممەتە ڕەحم پێکراوە ئەکەوێت، خۆ زانراویشە لەگەڵ بەرکەوتنیان شێوەی مردووەکانیش ڕەش ئەبێت، یاخود ئەگۆڕێت و ناشیرن ئەبێت، ئەمەش لە ئەنجامی بەرکەوتنی ئەوچەکە قورسانەی کە لەئاسمانەوە بەریان ئەکەوێت، ئینجا جاری واش هەیە ئەو شوێنەی کە چەکە قورسەکەی بەرئەکەوێت بە چەند کیلۆمەترێك چوار گۆشە قوڵی ئەکات، وەکوو تەقاندەوەی بۆمبی ئەتۆمی و هایدرۆجینی و غەیری ئەمانەش کە لە پێشتریشدا بینرا کەچی بەسەر خەڵکی هێرۆ شیماو ناکازاکی هێنا، وەچ زەرەرو زیانێکی بەو خەڵکەی ئەوناوچانە گەیاند، ئەمە جیا لەوەی ئێستاکە کە چەکەکان زۆر زۆر پێشکەوتوو ترن، وەکوو بۆمبی هایدرۆجینی ..هتد، بۆ نموونە ئەگەر لەوانە دوو سێ یەك بتەقێنەوە لەوانەیە شێوەی زەوی بگۆڕدرێت، ئەمەش دوور نیە ڕووبدات، چونکە لە فەرموودە هاتووە کەوا پێش هاتنی قیامەت سێ ڕۆچوون لە جەزیرەی عەرەب ڕووئەدات، بە بڕوای بەندە تەقینەوەی ئەو

[٨] (مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح)(ب١/ل١٨١/ ژ١٠٦/ل١٩/ژ١١٦).

**بۆمبانەیە کە لەو ناوچانە ئەتەقێنرێنەوە، لە مەوە دەرکەوت کەوا(خَسْفٌ) وە (قَذْفٌ) بارینی موشەك و صاروخ و چەکەکانی ترە بەسەر ئوممەت و ڕۆچونیان بەناو خاکدا، وە(مَسْخٌ) یش گۆڕینی شێوەی مرۆڤەکانە بەهۆی بەرکەوتنیان بەو چەکانە، بۆیە من بەشێوەیەکی واقعی سەردەم وەپشت بەستن بەقسەکانی پێشوو تری زاناکان ئەمەم ڕاڤە کرد خوای گەورەش زاناترە[٩].**

**وە لە ڕیوایەتێکی تردا پیاوێك پرسیاری کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە کەی ڕوودەدات؟ ئەویش فەرمووی: (إِذَا ظَهَرَتِ الْقَيْنَاتُ وَالْمَعَازِفُ وَشُرِبَتِ الْخُمُورُ)[١٠] واتە: (کاتێك ڕوودەدات ، ئەگەر بێت و کەنیزە[١١] گۆرانی بێژەکان و ئالەتەکانی موسیقا و خواردنەوەی شەرابەکان بە دەرکەوتن)[١٢].**

---

[٩] ئەم ڕاڤە کردنە جەنابی شێخ نەیهێناوە، بەندە بۆی زیاد کردووە، جا ئەگەر پێکابێتم ئەوە فەزڵ و چاکەی خوای گەورەیە، ئەگینا لێکدانەوەی نەفس و شەیتانەکەمە والله اعلم. وەرگێڕ

[١٠] صەحیحە. ترمذي لە (سنن الترمذي)(ژ٢٢١٢). وە تەبەڕانی لە(معجم الكبير)(ژ٥٨١٠). وە خەطیبی بەغدادی لە(تاريخ بغداد)(ب١١/ل٥٦٠/ژ٥٣٤١) وە غەیری ئەمانەش ڕیوایەتیان کردووە. ترمذي ئەفەرموویێت: "فەرموودەیەکی غەریبە". وە ئەلبانیش ئەفەرموویێت: "حەسەنە بەهۆی غەیری خۆی بڕوانە:(صحيح الترغيب والترهيب)(ب٢/ل٦٠٥/ژ٢٣٧٩)، وە هەروەها ڕیوایەتی تەبەڕانیشی لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە بە صەحیح داناوە (صحيح الجامع الصغير)(ژ٤٢٧٢).

[١١] ئافرەتی کەنیزە: ئەگەر سەیری جیهان بکەین، کۆمپانیاکان بە ئارەزووی خۆیان ئەم گۆرانی بێژە ئافرەتانە ئەکڕن، بۆ ئەوەی کلیپێکیان بۆ بەرهەم بهێنن، یاخود

**واتای (الظُّهور) لێرەدا: دەركەوتن و بـڵاو بوونـەوەو زۆری و دەست بەسەر داگرتنە، كەچی ئەو شتە خراپانە بوونەتە شتێكی ئاسایی و سروشتی، پەنا بەخوا(ﷻ).**

ئەوان خۆیان ئەكەن بە كەنیزەك وەكوو بەندە تاوەكوو بەناو بانگیان بكەن و بەرهەمەكانیان بلاّو بكەنەوە، وە ئەشكرێ گشت ئافرەتێكی گۆرانی بێژ بگرێتەوە، مەرج نیە كۆیلە بێت والله اعلم. وەرگێڕ

[١٢] ڕاستگۆی نوری چاوم تەنها ڕاستیش ئەڵێی هەمووی هاتۆتە جێ. وەرگێڕ

## تووڕەبوونی خوای گەورە

خوای گەورە(ﷻ) لە خەڵكی سەر زەوی تووڕە بووە بەهۆی كردەوە قێزەونەكانیان كە باسمان لێوە كرد، پەروەردگار ستەمی لەوان نەكردووە، بەڵكوو ئەمان بۆ خۆیان ستەمیان لە نەفسی خۆیان كردووە، وە پەیدابوونی بومەلەرزەكانی سەر زەوی لەوشكانی دەریادا، وە هەڵكردنی گەردەلوولە لەناوبەرەكان، وە دروست بوونی لافاوە تێكدەرەكان و ڕۆچوونە ترسێنەرەكان و جەنگە شێتاویەكان كە تەڕو وشك بەیەكەوە ئەسووتێنێ، وە مرۆڤەكان و ئاوەدانیەكان لەناو ئەبات، وە كارەساتی دەربەدەری و ئاوەركردنی خەڵكی ئاشتی خوازو غەیری ئەوانیش لێرەو لەوێ، لەو كیشوەرە یاخود لەكیشوەرێكی تر، وە ئەو وشكیەی كە بەر زەوی ئەكەوێ، یاخود ئەو نەخۆشیە كوشندانەی كە بلاْو بوونەتەوە لەسەر زەوی، لەمەو پێش شارستانێتی شتی وای بەخۆوە نەبینیوە، جا بە ملیۆنان خەڵكی وەكوو دروێنەكردن دووریوەتەوە، ئەمانەو شتی تریش نموونەی تووڕەبوونی خوای پەروەردگارمان نیشان ئەدات (ﷻ)، ئایا نابینن؟ هەروەكوو خوای گەورە(ﷻ) ئەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِاللَّيْلِ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾﴾[13] واتە: (ئەی بێ باوەڕان و بتپەرستان ئێوە لە

[13] سورة الصافات آية ١٣٧_١٣٨

**سەفەرەکانتاندا بەیانیان و ئێواران بە لای شوێنە کاولبووەکانی قەومی لوتدا(ﷺ) تێئەپەڕن و بە چاوی خۆتان ئەبینن کە چیان بەسەر هاتووە، ئەی نابێت هۆشتان هەبێت و عەقڵتان بخەنە کارو بیری لێ بکەنەوە تاوەکوو ئیمان بێنن)[١٤]**

**هەروەها ئەفەرموویێت:** ﴿أَفَلَمْ يَكُونُواْ يَرَوْنَهَا ۚ بَلْ كَانُواْ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا﴾[١٥] **واتە: (ئایا ئەمانە شوێنەواری ئەو کاولکاریە نابینن! یاخود بە تەمای زیندوو بوونەوە و لێ پرسینەوەی ڕۆژی دوایی نین)، هەروەها ئەفەرموویێت:** ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾[١٦]**، واتە: (تاوان و خراپە دەرکەوتوەو هەموو سەر زەوی و دەریاکانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە کە خەڵکی ئەیکەن و ماندوو نابن لێی، سەرەنجام ئەبێت تاڵی و ناخۆشی هەندێك لە کردەوەکانیان بچێژن (کە بەرپابوونی جەنگ و کارەساتە سروشتیەکانە) تاوەکوو بگەڕێنەوە لای پەروەردگارو ڕێبازە پاك و پیرۆزەکەی)[١٧].**

---

[١٤] تەفسیری گوڵشەن

[١٥] سورة الفرقان آية ٤٠

[١٦] الروم ٤١

[١٧] تەفسیری ئاسان

"خۆشەویستان" ئەوەیە تووڕە بوونی خوای گەورە(ﷻ) بەهۆی تاوانە سنوور بەزێنەرەكانیان، وە ستەمە یەك لە دوای یەكەكانیان، وە دەركەوتنی خراپەكانیان، وە دەرچوونیان لە دروستكراویان، هەر بۆیەش گوناهوو تاوان پیشەیانە، وە مرۆڤایەتی گوناهێكی وای ئەنجام نەداوە كە گەورەتر و ترسناكتر بێت لە بە درۆ خستنەوەی كیتابی خواو پێغەمبەرەكەی(ﷺ) وە ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژیان، ئایا كاتی ئەوە نەهاتووە كەوا مرۆڤایەتی هەست بەوە بكات و بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری(ﷻ)، سوێند بەخوا سزای ڕۆژی دوایی زۆر گەورەترو ناخۆشترە لە سزاو عەزابی دونیا، وە سزاكەشی زۆر بەئێشە، وە ژیانیش تیایدا بە هەتا هەتاییە، مردنی تێدا نیە و كۆتایشی پێ نایێت، وە من سێ پرسیار لەمرۆڤایەتی ئەكەم:

١. لەبەرچی دروستكراوین؟
٢. سەرەنجام و كۆتاییمان بەرەو كوێیە؟
٣. چارەنوسمان چیە؟

ئەمە حەقیقەت و واقعی ژیانە، خاوەن هۆشەكان ئەی بەش پێدراوان وەڵامەكان لە كوێن.

بەڵام ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿سَأَلْتُ رَبِّي ثَلاثاً، فَأَعْطَانِي ثِنْتَيْنِ، وَمَنَعَنِي واحِدَةً. سَأَلْتُ رَبِّي ألاَّ يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالسَّنَةِ، فَأَعْطانِيهَا، سَأَلْتُهُ أَلاَّ يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالْغَرَقِ، فَأَعْطانِيهَا. وسَأَلْتُهُ أَلاَّ يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ، فَمَنَعَنِيهَا﴾[١٨]، واتە:(سێ شتم لە پەروەردگارم داوا کرد، جا دوانی پێبەخشیم و دانەیەکی لێ قەدەغەکردم، داوام لە پەروەردگارم کرد: کەوا ئوممەتەکەم لەناو نەبات بە وشکە ساڵی [١٩]، پێی بەخشیم، وە داوام کرد کەوا ئوممەتەکەم بە خنکان[٢٠] لەناو نەبات، پێی

[١٨] صەحیحە. موسلم لە (صحيح المسلم)(ژ٢٨٩٠) لە عامیری کوڕی سەعدەوە ئەویش لە باوکیەوە. وە ئیبن وماجە (سنن إبن ماجە)(ژ٣٩٥٢). وە ئەحمد لە (مسند أحمد)(ژ١٥١٦) لە موعازی کوڕی جەبەلەوە، وە غەیری ئەمانەش ڕیوایەتیان کردووە. ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة)(ب٤/ل٣٠٢/ژ١٧٢٤).

[١٩] واتە: (وشەی ( بِالسنةِ) زانایان بەگرانی و وشکیەك کە گشت خەڵکی بگرێتەوە لێك داوەتەوە، واتە: داوام لە پەروەردگارم کرد ئوممەتەکەم بەتێکڕا بەقات و قوڕی وشکە ساڵی لەناو نەبات والله اعلم) وەرگێڕ.

[٢٠] واتە: مەلا عەلی قاری ئەفەرمووێت: "خنکانێکی گشتی وەکوو قەومی فیرعەون لەڕووبارەکە، وەکوو قەومی نوحیش لە تۆفانەکە، بۆ زیاتر دڵنیابوون لە پەراوێزی ژمارە ١٨- ١٩ با سەیری (مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح)(ب١٠/ل٤٣١/ ژ٥٧٥١) بکرێت.

بەخشیم، وە داوام كرد كەوا فیتنەو شەڕو ئاژاوەگێڕی لە نێوانیاندا نەبێت، ئەمەی لیٚ قەدەغەكردم) جا ئەگەر خوای گەورە(ﷻ)لێرە پەیمانی دابێت، كەوا ئوممەتەكەی لەناو نەبات بە وشكە ساڵی و نەبارینی باران، وە هەروەها لەناویشی نەبات بەهۆی خنكان، بەڵیٚ خۆشەویستان ئەو پەیمانە بە واتای پاراستنی گشتی دێت، تا لەناو نەچن بەیەك جاری لە كاتی پەیدابوونیان، وە نەك لەبەر هەندێك لە بەشەكانی (كە جار جارە خەڵكی ولاٚتەكان لەناو ئەبات) جا ئوممەتی ئیسلام پارێزراوە لەوانە لەگشتیەكەی، وە یەكێكی تر لە واتاكانی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: كەوا ئوممەت سزا دراوە بە كارەساتە گشتیەكان، ئیتر بەشێكی بەركەوێت یاخود بەگشتی، ئەمەش مافی خۆیەتی لەبەر گوناهوو ستەمەكانیان، بەلاٚم بەرێزان وەچەو پشتی ناپچڕێت، هەر وەكوو بەسەر ئوممەتەكانی تری پێشوو ڕابوورد، ئەوەتە خوای گەورە(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ۝٥ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُواْ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ۝٦ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ۝٧ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ۝٨ وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ

بِٱلْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَـٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾﴾[21] واتە: (هەرچی گەلی سەمودە ئەوە بەدەنگێکی گەورەی سامناك لەناو بران، بەلاّم گەلی عاد بە هەلّکردنی بایەکی ساردی دەنگ گەورەی سامناك لەناوبران، ئەوەبوو خوای گەورە ئەو بایەی بۆناردن و زالّی کرد بەسەریاندا، بۆ ماوەی حەوت شەو و هەشت ڕۆژان بەدوای یەکدا، جا ئەگەر تۆ لەوێ بوویتایە ئەوانت ئەبینی کە وەکوو درەختێکی کلۆر و ناوڕزی کە خۆی پێ ڕانەگیرێ و بکەوێتە سەر زەوی، ئەمانیش بەو جۆرە بوون بەر ئەبوونەوەو ئەمردن لەترسان، ئایا ئەو گەلە ستەمکارانە هیچ وەچەیان لە پاش خۆ بەجێ ماوە! یاخود کەسیان ماوە تاوکوو بیانبینیت! ئینجا فیرعەون و ئەو گەلانەی پێش فیرعەونیش و خەلّکی گوندەکانی گەلی لووتمان سەراوبن کردن و بە تاوانی گەورە گەڕانەوە لای ئێمە، ئەوان سەرپێچی پێغەمبەری خوای خۆیان کرد و بڕوایان پێ نەکرد، سەرەنجام خوای گەورەش ئەوانی زۆر بەتوندی گرت و لەناوی بردن، وە کاتێکیش ئاوی تۆفانەکەی گەلی نووح زیادی کردو سنووری

[21] سورة الحاقة آية ٥- ١٢

چیاکان و غەیری چیاکانیشی بەزاند، ئێمەش ئێوەو باوك و باپیرانی ئێوەمان[٢٢] لەناو کەشتیەکەدا هەڵگرت و پاراستنمان لە خنکان، هەموو ئەمانەشمان کە باس کرد بۆ ئێوە، بە لەناو بردنی ستەمکاران و ڕزگارکردنی ئیمانداران، تاوەکوو ببێتە بیرخەرەوەیەك و پەندو ئامۆژگارییەك بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە هۆشمەندن، کاتێك شتێك ئەبیستن بە گوێکانیان و پەندو ئامۆژگاری لێوەرئەگرن و سنووری خوای گەورە ئەپارێزن).

ئیتر بۆ بیرناکەنەوەو وریا نابن!!!

خوای گەورە پاداشتی پێغەمبەرمان تکاکارمان لەبەرامبەر ئێمە بەباشترین پاداشت کە پێغەمبەرێك بۆ ئوممەتەکەی کردوویەتی خەڵات بکات(ﷺ)، بە دایك و باك و ڕۆحمەوە وە لەوەش کە پێمدراوە فیدات بێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

---

[٢٢] وشەی (حملناکم) واتە: ئێوەمان هەڵگرت، چونکە ئەو چەند کەسەی کە لەگەڵ گەورەمان نووح بوون(ﷺ)، زانایان ئەفەرموون: ئەمانە باوکی مرۆڤایەتین، لەوانەوە شارستانیەت بڵاوبوەتەوە، ئایەتەکە ڕووی لە مرۆڤایەتی کردووەو ئەفەرمووێت: ئێوە کاتێك لە پشتی بابیرە گەورەکانی مرۆڤایەتی بوون لەناو شریتی (DNA)دا ئێوەو ئەوانمان ڕزگار کردن لە مردن. والله أعلم

## چارەسەر چیە بۆ ئەوەی دوور بین لە بەلاَکان.

چارەسەری ئێمە خۆپارێزی و تەقوایە، وە حوکم کردنە بە شەریعەتی ئیسلام، وە ئارام گرتنە لەسەر ناخۆشیەکان و دامەزراویمانە لەسەر دین و جیهاد، وە پاڕانەوەو موناجاتیش لەگەڵ بیرکردنەوەو زیکرکردن بە دڵ و فیکر لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا، وە ڕەخنە نەگرتن لە قەزاو قەدەری خواو شتەکانی تر، وە پەلە نەکردنیش لە شتەکان، بەو جۆرە لەگەڵ خوا بن، داهاتوو و پشتیوانی کردنیش هەر بە دەست خودایە(ﷻ)، بۆیە ئەفەرمووێت:﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾[٢٣] واتە: (بێگومان هەرکەسێك تەقوای خوا بکات و خۆ لە گوناهوو تاوان بپارێزێ، وە لەگەڵ تەقواکەشیدا خۆگر و ئارام بێت لەسەر ناخۆشیەکان و خواپەرستیەکان، ئەوکاتە خوای گەورە بە باشترین پاداشت خەلاَتی ئەکات، چونکە خوای گەورە چاکەی هیچ کەسێکی چاکەکار بەزایە نادات و بەفیڕۆی نادات).

---

[٢٣] سورة يوسف آية ٩٠

خوایەگیان مەمان گرە بەهۆی تاوانەکانمان و کردەوەی ستەمکارەکان کە لەناو ئێمەدا ئەیکەن، وە بەو جۆرەش لەگەڵمان بە کە خۆت ویستت لیێ یەتی بەمیهرەبانیەکەت نەك بە دادپەروەرییەکەت، وە بەمیهرەبانیە تایبەتی و گشتیەکەی خۆت ڕەحم بەو ئوممەتە ستەم لێکراوە بکەی، کە گیرۆدەبووە بە نەفسەکان و غەفڵەت و دوژمنەکانی، ئەی گەورەو پاشامان ئەی لانەو سەرخەری مەزلۆمان یا اللە، ئەو کەسە سەربخە کە دینەکەت سەر ئەخات، وە ئەوکەسەش زەلیل و سەرشۆڕکە کە ئەیەوێ ئێمەو موسڵمانان زەلیل و سەرشۆڕکات، بەرزکەرەوە ئالأی حەق و نوور بەسەر ئەو ئاوەدانیانە، ئەی میهرەبان ترینی میهرەبانان، وە ئەی ڕێزدار ترینی ڕێزداران، وە ئەی بەخشندە ترینی بەخشندەکان. ئامین .. ئامین .. ئامین

صَلِّ عَلى عَبْدِكَ وحَبِيبِكَ خَاتَمَ الأنْبياءِ والُمرسَلِين، ناصِرِ الحَقِّ الهادِي إلى صِراطٍ مُسْتَقِيم، وعَلى آلِهِ وأصْحابِهِ، ومَنْ والآهُ ـ إلى يَومِ الدِّين ، والحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ العَالَمِينَ.

## هۆكاری دواكەوتنی سەركەوتن

خوای گەورە ئەفەرموویت: ﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾[٢٤] واتە:(بۆ پاكردنەوەیان لە گوناهەكان و عەیبەكان، وە سپی كردنەوەی دڵەكانیان، ئەگەرچی بە زۆریش تووشیان بوو بێت، چونكە شەهید بوون و جەنگ كردن لە پێناو خوادا(ﷻ) گوناهەكان ڕەش ئەكاتەوە، وە عەیبەكانیش نامێنێت، وە دووڕووەكانیش جیائەكرێنەوە، ئیتر ڕزگاریان ئەبێت لە دەستیان، وە ئەوكاتە ئەزانن كێ ئیماندارە و كێ دووڕووە، ئینجا پاش ئەمانە خوای گەورە(ﷻ) شان و شكۆ و هەیبەتی كافرەكانیش ئەشكێنێت و غیرەتیان لە دڵ ناهێڵێت و كەمیان ئەكاتەوە، چونكە ئەمە هۆكاری لەناو چوونەكەیانە، وە هەروەها تاوەكوو بۆیان ببێتە سزاو سەرشۆڕی، چونكە ئەگەر سەركەوتن بەدەست بهێنن، یاخی ئەبن و تاوان لە بۆ تاوان زیاد كەن، بۆیە پێویستە ئەمانە بە سزادان چارەسەر بكرێن، لەبەر میهرەبانی كردن بە بەندە ئیماندارەكانی. (خوایەگیان ئەو كەسە سەربخە كە دینەكەت سەر ئەخا، وە ئەوكەسەش زەلیل و

[٢٤] آل عمران ١٤١

سەرشۆڕکە کە ئەیەوێت ئێمەو موسڵمانان زەلیل و سەرشۆڕکات) ئامین .

"بەڵێ خۆشەویستان"

چەندین هۆکار هەن لە دواکەوتنی سەرکەوتن بۆ دینی ئیسلام، یاخود سەرکەوتن بەسەر ئەهلی باتڵدا لە کافرەکان و غەیری ئەوانیش، جا لە هەموویان گرینگتر

یەکەم: دووربوونی خەڵکە لە خوا(ﷻ)، هەروەکوو خوای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ﴾[٢٥] واتە: (ئەمە فەرمانی خوایە بۆ ئیمانداران، ئەگەر ئێوە خوا سەر بخەن بەهۆی دەست گرتن بەدینەکەیەوە، وە هەروەها بانگەواز کردنیش بۆ لای، وە جیهاد کردنیش لە دژی دوژمنەکانی، وە مەبەستیش لە هەموو ئەوکارانە تەنها بۆ خوایان بێت، جا ئەگەر ئەوانەیان کرد ئەوکاتە خوای گەورەش(ﷻ) سەریان ئەخات و دامەزراویان ئەکات، واتە: (دڵەکانیان بەهێز ئەکات بەهۆی دامەزراوی و ئارامی و نووری ئیمانەوە، وە ئەمانەش بەسەر لاشەکانیاندا ڕەنگ ئەداتەوە، وە یارمەتیشیان ئەدات تاوەکوو

[٢٥] سورة محمد آية ٧

سەركەون بەسەر دوژمنەكانیان، جا ئەمە پەیمان و بەڵێنی خوای گەورەیە(ﷻ) كە زاتێكە ڕاستگۆیە لە بەڵێنەكانی هەروەكوو فەرموویەتی: ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا﴾[٢٦] واتە: بەڵێنی خوا ڕاستەو حەقە، جا كێ هەیە لە خوای گەورە ڕاستگۆتر بێت لە هێنانە جێی بەڵێنەكانیدا، بێگومان ئەوەی بە وتە و كردەوەكانی ئەو سەربخات، لە مەودوا مەولاكەی سەری ئەخات، لە ڕێی دامەزراوی و غەیری ئەویش هۆكارەكانی سەركەوتنی بۆ ئاسان ئەكات.

دووەم: ناكۆكی نێوان بەندەكان و بانگخوازەكان و موجاهیدەكان، هەر وەكوو ئەفەرموێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾[٢٧] واتە: جیاواز مەبن لەگەڵ یەكتری، چونكە جیاوازی بوون و ناكۆكی كردن لەگەڵ یەكتر، ئەبێتە مایەی دۆڕاوی و بێ هێزی و ترسنۆكیتان. ﴿فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ﴾ واتە: ورەو جوامێریتان ئەڕووخێنێ، وە ئەبێتە مایەی پەرتەوازەیی لە هێزو تواناتان، وە دەوڵەتەكەشتان نامێنێ و ئەڕووخێت، وە

[٢٦] سورة النساء آية ١٢٢

[٢٧] سورة الأنفال آية ٤٦

ئەو بەڵێنانەی کە پێتان دراوە بۆ سەرکەوتن و غەیری ئەویش لەسەرتان هەڵئەگیرێتەوە. ﴿وَٱصْبِرُوٓاْ﴾ ئارام بگرن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، لە کاتە ناخۆشەکانی جەنگ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ بەڵێ خوای گەورە لەگەڵ ئارام گرەکانە، ئەمەش بە یارمەتیدان و سەرخستن و پشتگیری کردنیان، دەکەواتە ترسی خواتان هەبێت و لێی بترسێن، وە خۆشتان زەلیل کەن بۆی، وا بکەن کەوا لەسەر یەك وشە بن، چونکە کۆك بوونی نێوان موسڵمانەکان ئەصلْ و بیناغەی دینە، وە یەکەمین خراپە و سەری گومڕایی بوون جیاوازییە لە کردەوەکان، وە هەروەکوو چۆن کۆك بوون لە دین و بیروباوەڕدا پێویستە، ئا بەوجۆرەش پێویستە کۆك بوون لەبیرو بۆچوون و عەزیمەتیشدا هەبێت، وەکوو خۆشەویستمان فەرموویەتی: (عَلَيْكُم بِالسَّوادِ الأَعْظَم)[٢٨]، جا بۆ ڕوونکردنەوەی

[٢٨] حەسەنەو شاهێدیشی زۆرە. ئیمام ئەحمەدلە (مسند أحمد)(ژ١٨٤٥٠) لەئەبو ئومامەی باهلی. وە ئیبن وماجە لە (سنن إبن ماجە)(ژ٣٩٥٠). وە حاکم لە (مستدرك حاكم)(ژ٣٩٢). وە تەبەڕانی لە(مسند الشاميين)(ژ٢٠٦٩) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە بەمەڕفوعی، وە غەیری ئەمانیش ڕیوایەتیان کردووە، حافزی سەخاوی ئەفەرمووێت: "ئەو فەرموودە مەتنەکەی بەناوبانگە، وە سەنەدەشی زۆرە، وە چەندین شاهێدیشی هەیە لە مەڕفوع و غەیری ئەویش(المقاصد الحسنة)(ژ١٢٨٩).

**ئەم فەرموودەیە ئیمامی قوشەیری[٢٩] ئەفەرموویت: "یەكدەنگی زانایان حوججەو بەڵگەیە، وە نویژ كردنی بەكۆمەڵیش سوننەتێكی موئەككەدەیە، بەدواكەوتنی ئاكارو ڕەوشتی**

---

وە ئەلبانی بە زەعیفی داناوە (ضعیف الجامع الصغیر)(ژ١٨١٥). وە ئیبن وحەجەری هەیثەمی ئەفەرموویت: "عبداللە كوڕی ئیمام ئەحمد و بەززار و تەبەڕانی ڕیوایەتیان كردووە، وە پیاوەكانیشیان باوەڕپێكراون (المجمع الزوائد)(ب٥/ل٢١٨/ژ٩٠٩٧). وەرگێڕ

[٢٩] ئەبو قاسم عبد الكریمی كوڕی هەوازنی كوڕی عبد الملیكی كوڕی گەڵحەی كوڕی محمدی ئیستوائی قوشەیری نەیسابووری شافیعی صۆفیە، (د٣٧٦هـ_و٤٦٥ه) لە شاری ئیستووا لە دایك بووە، وە سەبارەت ناسناوەكەی ئەوە دراوەتە پاڵ هۆزی قوشەیری كوڕی كەعب، بە هەتیوی گەورە بووە، یەكێكە لە زانا هەرە بەرزەكان و ئەولیا گەورەكان، توانیویەتی خزمەتێكی زۆر بەم ئیسلامە بگەیێنێ، یەكێك بووە لە زاهیدە مەزنەكان، وە قوتابی و موریدی مامۆستای زەمانی خۆی ئەبو عەلی دەققابووە، وە هەر لە تەنیشت ئەویش لەشاری نەیسابوور نێژراوە، وە هاوەڵایەتی گەورە ئەولیای ئەم ئوممەتە و مامۆستای ئیمامی غەزالی ئەبو عەلی فارمەدی كردووە، ئیمامی قوشەیری، مەزهەبی شافیعیە، وە لە ئوصولێشدا ئەشعەریە، وە لە تەریقەتیش سەنەدەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ شێخ جونەیدی بەغدادی. ئیبن وتەیمیە (ﷺ) بەو جۆرە وەسفی شێخ جونەید ئەكات: (لەبەر هەندێ شیخ جونەید گەورەی ئەو كۆمەڵەیە (واتە صۆفیەكان) چونكە ئیمامێكی سەر ڕاستە و ڕێنموویی كراوە (....) وە لە شوێنێكی تردا هاتووە (شێخ جونەید و ئەوانەی وەكوو ئەوون پێشەوای سەر ڕاست و ڕێنموویی كراون). بڕوانە (مجموع الفتاوی)(ب٥/ل٢٩٢/٢٩١). وە ئیمامی قوشەیری زۆر كتێبی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە بەناوبانگترینیشیان (الرساله القشیریه، لطائف الإشارات...وە هتد). بڕوانە: (مقدمة الرسالة القشيرية)(ل٥) طبعة دار الكتب العلمية.

پێغەمبەرو پێشینەی ئوممەت چاکەو سوپاس کراوە، داهێنان و زیادکردنی شتانیش لە دین گومڕاییە"[٣٠].

هەروەها موریدو پەروەردەی بەردەستی شێخ عبد القادری گەیلانی موجتەهیدی مەزهەبی حەنبەلی حەزرەتی ئیبن و قودامەی مەقدیسی(ﷺ)[٣١] ئەفەرمووێت: "سەبارەت بە

[٣٠] (لطائف الإشارات)(ب١/ل٦٢٩).

[٣١] عبد الله کوڕی ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی قودامەی کوڕی میقدامی کوڕی نەصری کوڕی عبد الله مەقدیسی پاشان دیمەشقیە، لە فەلەستین لە ساڵی (د٥٤١ھ) دایکبووە، وە لە ساڵی (و٦٢٠ھ) وەفاتی کردووە. یەکێکە لە شەرعناسەکان، وە ئیمامێکی زاهید بووە، شەیخولئیسلامە، وە یەکێکە لە کەسە دیارو بەناوبانگەکان، وە موریدو قوتابی شێخ عبد القادری گەیلانی بووە. وە یەکێکە لە زاناکانی مەزهەبی حەنبەلی، وە هەروەها یەکێکە لەو کەسانەی کە فەتحی قودسیان کردووە لەگەڵ سولتان نور الدین و سولتان صلاح الدین. وە چەندین کتێبی هەیە لەوانە ("مغنی فی الفقه" کە گەورەترین کتێبیتی لەسەر مەزهەبی حەنبەلی، العمده فی الفقه...هتد)، وە ئەو زاتە مەزنە یەکێك بووە لەوانەی کە کەرامەتی لێوە بینراوە بۆینموونە حافیزی ئیبن و ڕەجەبی حەنبەلی ئەفەرمووێ:" نوسینێکم خوێندووە بە دەست نووسی حافیزی زەهەبی کە نوسرابوو: گوێم لە هاوەڵی خۆمان ئەبو طاهری دەربی بوو، ئەویش گوێی لە شێخ ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەد کوڕی حاتەم بوو کەوا لەگەڵی چوومە لای گۆڕی شێخ مۆفەق واتە: (ئیبن و قودامە) جا فەرمووی: گوێم لە شێخمان شەرعزان محمد یونینی بوو کەوا فەرمووی: " شێخ مۆفەقم بینی لەسەر ئاو ئەڕۆیشت". بڕوانە (الذیل في طبقات الحنابلة)(ب١_ل١٣٣_١٤٢).

شوێنکەوتنی یەکێك لە ئیمامەکانی چوار مەزهەبەکە (ئیمامی ئەبو حەنیفە و ئیمامی مالك و ئیمامی شافعی و ئیمامی ئەحمەد)، ئەوا زەمکراو نیە واتە: (قەدەغە کراو نیە) لەبەر ئەوەی جیاوازی لەڕاو بۆچوون لە فەرعەکانی دین (فیقھ) ڕەحمەتە، جا ئەو کەسانەی کە جیاوازیان هەیە لە ڕاو بۆچوون ئەوە سوپاس کراون، وە هەروەها بەهۆی ئیجتهاد و جیاوازی لە ڕاو بۆچوونەکانیان بەڕەحمەتێکی گەورەو فراوان پاداشت دراون، وە کۆك بوونیشیان (لە شتێکدا) بەڵگەیەکی بڕەڕە"[٣٢]، واتە: (ئەگەر لەسەر شتێك ئیتیفاقیان کرد ئەوە پێویست بە موناقەشە و دوودڵی ناکات وەری گرن، هەروەکوو خۆشەویست فەرموویەتی: (لَنْ تَجْتَمِعَ أُمَّتِي عَلى ضَلالَةٍ ، فَعَلَيْكُم بِالجَماعَةِ فَإِنَّ يَدُ اللّهِ عَلى الجَماعَةِ)[٣٣] واتە: هەرگیز ئوممەتەکەی من لەسەر

---

[٣٢] (لمعه الإعتقاد لإبن قدامه المقديسى الحنبلى القادرى)(ل٤٢).

[٣٣] حەسەن و صەحیحە. ترمذی لە (سنن الترمـذي)(ژ٢١٦٧). وە ئـیبن وماجـە لـە (سنن إبن ماجه)(ژ٣٩٥٠). وە حاکم لە (مستدرك)(ژ٣٩٩) لە ئیبن عەبباسـەوە، وە بەیهـەقی لـە (الأسماء والصـفات)(ب٢/ل١٣٣/ژ٧٠٢). وە تەبـەڕانی لـە( معجـم الكـبير)(ژ١٣٦٢٣- ژ١٣٦٢٤) لـە ئـیبن و عومـەرەوە ڕیوایـەتیان کـردووە. ئـیبن وحەجەری هەیثەمـی ئەفـەرمووێت: "تەبـەڕانی بـەدوو سـەنەد ڕیوایـەتی کـردووە، پیاوەکانی سەنەدێکیان باوەڕپێکراو پیـاوانێکی صـەحیحن، تـەنها مـەرزوقی ئـالی طەڵحە نەبێت ئەویش(ثقـة)یە باوەڕ پێکـراوە (المجمـع الزوائـد)(ب٥/ل٢١٨/ژ٩٠٩٨)

گومرایی کۆنابنەوە، بۆیە لەسەرتانە دەست بە کۆمەڵەی موسڵمانانەوە بگرن، چونکە دەستی خوای گەورە لەگەڵ کۆمەڵدایە) واتە: هەرکاتێك ئەوان بوونە کۆمەڵ و یەکیان گرت، ئەوە خوای گەورەش(ﷻ) یارمەتیان ئەدات و سەرکەوتوویان ئەکات.

سێ یەم: جیاکردنەوە لە نێوان خۆشەویستی پەروەردگارو جیهاد کردندا، ئەمەش یەکێکە لە گوناهوتاوانە گەورەکان، وە چاوەڕێی هاتنی سزای خواشی لێ ئەکرێت، خوا پەنامان بدات، هەروەکوو فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾[٣٤]، واتە: (ئەی محمد(ﷺ) پێیان بڵێ: ئەگەر باب و باپیرانتان و براکانتان

---

ئەلبانی ڕیوایەتەکەی ترمذي کە لە ئیبن و عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە ئەفەرمووێت: "صەحیحە بێ لە وتەی(ومَنْ شَذَّ شذَّ)"، بڕوانە: (صحيح الترمذي)(ژ٢١٦٧).

تێبینی:

ئەو فەرموودەیە جەنابی شێخ نەیهێناوە پێمان باش بوو زیادی کەین. وەرگێڕ

[٣٤] التوبة ٢٤

و هاوسەرانتان و عەشیرەت و هۆزەكانتان و ماڵ و سامانێك كە بەدەستان هێناوە، یاخود بازرگانیەك ئەترسن كە شكان و بێ بازاڕی ڕووی تێ بكات و خانووبەرەو كۆشك و تەلارێك كە حەز ئەكەن لێتان تێك نەچێت و دڵخۆشن پێی، گشت ئەمانە لاتان خۆشەویستو نازدارتربێت لە خواو پێغەمبەرەكەی و جیهادو تێكۆشان لەپێناو ڕێبازەكەی خوای گەورەدا(ﷻ) جا چاوەڕێكەن هەتاوەكوو خوای گەورە سزاو عیقابی خۆی بۆتان ئەنێرێ، وە خوای مەزن(ﷻ) هیدایەتی گەلێكی ستەمكارو خراپەكار نادات كە گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو ناكەن)، جا كۆكردنەوە لەنێوانیان خۆشەویست خواو جیهادكردن، ئەوە دینداری و سەركەوتن و ڕەمەزاندی خوای پەروەردگارە(ﷻ) هەروەكوو پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرموویەتی: (هَبَطْتُمْ مِّنَ الجِهَادِ الأَصْغَرِ إلى الجِهَادِ الأكْبَرِ وهو جِهادُ النَّفْسِ)[٣٥] واتە: (ئێوە لە

[٣٥] حەسەنە بەهۆی شاهێدەكانیەوە. بەیهەقی لە (الزهد الكبیر)(ژ٣٧٣) لە جابری كوڕی عبدالله وە(رضي الله عنهما) ڕیوایەتی كردوەو ئەفەرمووێت: "ئەم سەنەدە زەعیفە". وە خەطیبی بەغدادی لە (تأریخ بغداد)(ب١٥/ل٦٨٥/ژ٧٢٩٧) لە جابرەوە ڕیوایەتی كردووە، حافزی ئەبو فەیزی غوماری ئەفەرمووێ: ئەو فەرموودەیە شاهێدی زۆرە با سەیری (المداوی لعلل الجامع الصغیر)(ب٤/ل٤٦٠/ژ٦٢٢٢)بكرێت. ئەلبانیش

جیهادی بچووکەوە دابەزین بۆ جیهادی گەورە، کە جیهادی نەفسە) لەبەرئەوەی هەردوکیان زۆر گەورەو گرینگن بۆیە کۆکردنەوەش لەنێوانیان هێنانەدی هەموو ئاواتەکان و دەستکەوتنی هەموو پاداشتەکانە، هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾[٣٦] واتە: ئەوانەی لەپێناوی ئێمەدا جیهادی بچوکیان کرد کە جیهادی نەفسە ، وە ئەوانەش کە جیهادی گەورەیان بەماڵ و گیانی خۆیان بۆ ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتی کرد، سوێند بەخوا ڕێنموویان دەکەین، بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان) ئەوە ڕێگاکانی ڕۆیشتنە بەرەو دەرگای خوا(ﷻ)، وە ڕێگاکانی گەیشتنە بە ڕەزامەندی خوا، وە زیاتر هیدایەتیان ئەدات بۆ ڕێگاکانی خواپەرستی، وە پشتیوانیشە بۆ سالیکەکانی ڕێگای ئەهلی ویلایەت.[٣٧]

---

ڕیوایەتەکەی خەتیبی بە زەعیف داناوە، بڕوانە: (ضعيف الجامع الصغير)(ب١/ل٥٩٥/ژ٤٠٨٠)

[٣٦] سورة العنكبوت آية ٦٩

[٣٧] سالیکەکانی ڕێگای ئەهلی ویلایەت ئەو موریدانەن کە هاتوونەتە نێو بازنەی ویلایەت، خوای گەورە بەشیان ئەدات لە زانستی قەلبیدا، وە بەنووری دڵ شتەکان ئەبینن، وە مەرجیش نیە بگەنە پلەی فیراسەت. وەرگێڕ

وە هەروەها خوای گەورە ئەفەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ﴾[٣٨] واتە: ئەوانەی کەهیدایەتیان وەرگرت بۆ بەدواکەوتنی پێغەمبەری حەق محمد المصطفی(ﷺ) ئەوە خوای گەورە(ﷻ) هیدایەتەکەی بۆ زیاتر کردن، بۆئەوەی زیاتر دامەزراو بن و بەسەرکەون بەپایەکانی ئیماندا، جائەوانەی لەپێناو خوای گەورەدا بە ماڵ و گیانی خۆیان جیهاد ئەکەن، یاخود ئەو شتانەی کە لەسەریان نوسیویەتی (ڕازینە پێی) ئەوە خوای گەورە هیدایەتدەر و یارمەتی دەرو پارێزەرو چاودێریکەری ئەو کەسانەیە، ئەو لەگەڵیانە، (خۆشبەختی بۆیان) ئەوان لە پلە نزیکەکانن لای مەولاکەیان(ﷻ)، ئەمانەش چاکەو بەخششی خوای میهرەبانە ئەیبەخشێ بەو بەندانەی کەویستی لێ بێت، وە بێگومان پەروەردگارت خاوەن فەزڵ و بەخششە، (پەروەردگارە خۆت نیعمەتت داوە، بۆمان زیادی کە).

---

[٣٨] محمد ١٧

# سێ بەلاَ کوشندەکە

"بەڵێ خۆشەویستان" هەندێك لەو بێ شەرمیانەی ئەم زەمانە کە بەسەر خەڵکیەوە کۆبووەتەوەو فیتنەو نەهامەتیەکانی وەکوو بورکان تەقیوەتەوەو بلاَو بووەتەوە لە گشت لایەکدا، ئەوەش بریتی یە لە دەردو بەلاَکانی نێو نەفسەکان و ماڵەکان و جێگای کۆبوونەوە گشتیەکان، هۆکاری ئەمانەش لە سێ خاڵەوە سەرچاوەی گرتووە.

بەلاَی یەکەم: فیتنەی تەلەفزیۆن: ئامێرێکە بۆ ڕابواردن بەکاردێت، وە لەگەڵ هەندێش زۆر شتی قەدەغەکراویشی تێدایە، بەداخەوە ئێستاکە گشت ماڵێکی گرتووەتەوە، وە هەروەها بۆ کات بەسەر بردن و بێ ئاگابوون، یاخود خۆ سەرقاڵ کردن بۆ غەیری خوا(ﷻ) کە هەندێك جار گوناهوو تاوان و بێ شەرمیشی لێ ئەکەوێتەوە، کەچی باش ئەزانین ئێمە بەرپرسیارین لەوانە، هەروەکوو خوای گەورە(ﷻ) ئەفەرموویێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَـٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ

وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾[٣٩] واتە: ئەی ئەوکەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، چونکە ئاگرێکە سووتەمەنیەکەی بەردو خەڵکە، وە چەندین فریشتەی بەهێزی توندی دڵ ڕەق سەرپەرشتی ئەو دۆزەخە ئەکەن، کە هەرگیز بێ فەرمانی خوای گەورە ناکەن لەو کارانەی کە فەرمانیان پێ ئەکات، وە ئەوانیش وەك بەندەیەکی گوێڕایەڵی بەردەستی پەروەردگار فەرمانەکان جێ بەجێ ئەکەن و سەرپێچی ئەو ناکەن. بەڵێ: خۆتان بپارێزن لەو ئاگرە بەهۆی وازهێنان لە تاوان و بە کردنی خواپەرستیەکان و دوورکەوتنەوە لە شتە خراپ و قەدەغەکراوەکان کە خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) تووڕە ئەکات، ماڵ و منداڵەکانیشتان لێی بپارێزن، ئەمەش بەهۆی فەرمان بەچاکە کردن و ڕێگری کردنیان لە خراپە، وە فێری شتە چاکەکان و فەرمانەکانی شەرعی پیرۆزیان بکەیت، وە بە ڕەوشت و ئەدەبی قورئان و پێغەمبەری خواو خۆشەویستیەکەی و ئال و بەیت و یاران و دۆستانی(صلى الله عليه وآله وسلم) فێرە ئەدەبیان بکەیت، ئەمانەش کۆمەڵە ڕەوشتێکی بەرزی ئیسلامەتیە، هەر بەهۆی ئەوەوە ئەبێتە

[٣٩] التحريم ٦

هۆکاری پاراستنی خۆت و ماڵ و منداڵەکەت لە ئاگری دۆزەخ، خوا پەنامان بدات.

**بەلای دووەم:** فیتنەی موبایل: کە بەهۆیەوە درۆو وشەی حەرامی لیٚ ئەکەویٚتەوە، وەکوو هاوەلأیەتی کردنی کچ و کوڕ و بەکارهیٚنانی وشەکانی خۆشەویستی بۆ غەیری خوا بەنهیٚنی، وە غەیری ئەوەش لەوەی کە خاوەنی شەرعی پیرۆز هۆشداری لەسەر داوە، جا ئەم وشانە ئەنوسریٚت و پیٚشانی پەروەردگاری هەموو جیهانیان ئەدریٚت، ئەمە چ بیٚ شەرمیەکە، لە کاتیٚدا کە خوای گەورە خۆی ئاگادارە بە شتە خراپەکان و کردنی گوناهە گەورەکان لە ڕیٚی بیستن و بینینەوە.

"بەڕیٚزەکەم " ڕۆژیٚك دادیٚت زیندوو ئەکریٚیتەوە بە تەنیاو بیٚ کەسی، بەرەو لای پەروەردگارت ڕاپیٚچت ئەکەن، ئالەو کاتەدا ئەندامەکانت شایەتیت لەسەر ئەدەن، هەروەکوو ئەفەرموویٚت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾[٤٠]، واتە: ئەی مرۆڤـ بەدوای شتیٚك مەکەوە کە زانیاریت دەربارەیەوە نیە، بەڵکوو دڵنیاکەوە

[٤٠] سورة الإسراء آية ٣٦

و بیسەلمێنە، چونکە مرۆڤ بەرپرسیارە بەرامبەر گوێ و چاو و دڵێدا.

"خۆشەویستان" دینی پیرۆزمان ڕێنومایمان ئەکات بۆ بەدوانەکەوتنی گومان و بیرکردنەوە خێراکان (الظَنُّ والحَدْس)، وە دوای شتێك نەکەوین کە زانست و مەعریفەتمان لەبارەیەوە نیە، بۆیە ڕاست و دروست نیە کەسێك شتێك بلێت یاخود کردەوەیەك بکات بێ ئەوەی زانستی لەبارەیەوە هەبێت، وە هەروەها بۆ تۆ شیاو نیە بە خراپی باسی کەسێك بکەی کە نایناسیت، وەکوو شایەتیدانی بە درۆ و درۆکردن لە قسەکردندا، وە بوختان کردن و قسەپێ وتن بە وشەی بێ ڕەوشت و پیس و نزم، وە قسەکردن لە بارەی خەڵکەوە بەهۆی گومانەوە، وە چاوگێڕان بۆ عەیب و ناموسی خەڵکی، هەموو ئەمانە حەرامە لە ڕووی شەرعەوە، لەبەر ئەوەی خاوەنی ئەو چاوو گوێچکەو دڵە بەرپرسیارە لەبەردەم پەروەردگار، ئیتر پێی ئەوترێت: بۆچی گوێت لە شتێك ڕاگرت کە ئەو گوێگرتنەت بۆ حەڵاڵ نەبوو؟ وە بۆچی تەماشای شتێکت کرد کە ئەو تەماشاکردنەت بۆ حەڵاڵ نەبوو؟ بۆچی نیەتت هێناو عەزمت کرد بۆ کردنی شتێك کە کردنی ئەم شتەت بۆ حەڵاڵ

نەبوو؟ برای خۆشەویست و خوشکی ئازیزم بزانـە: چـاوگێڕان بۆ عەیب ناتەواوی خـەڵك و گـوێگرتن و تەماشـاکردنی شـتی حەڕام، هەم دەردە هەم شوورەیشە کە توشی ئەوکەسە ئەبێت لـە هەردوو دونیا خوای گەورە پەنامان بدات.

"بـەڕێزان" هەرکەسـێك ئـەو ئەندامانـە لـەخواپەرسـتیدا بـەکاربهێنێ، ئـەوە ئەمانەتەکـەی بـە سـەلامەتی تەسـلیم کردووەتـەوە، هـەر بۆیـەش شـایەنی ڕێزلـێنـان و مەدحـە، وە پێچەوانەی ئەوەش هەرکەسێك پیسی بکات ئەوەش بە کردنـی ئەوکارانـەی کـە پێچـەوانەی شـەریعەت و پلـەو مەقامـە ڕێزلێگیراوەکانی شـەریعەتن، ئـەوە شـوێنەواری خیانـەتی لـێ دەرکەوتووەو پێویستیش ئەکات سوکایەتی و لۆمە بکرێت.

بەلاّی سێ یەم: ئەویش فیتنەی بێ ئاگاییە لـە خوای گەورە(ﷻ)، وە دوور کەوتنەوەی ئەحواڵی دڵەکان لـە خوای گەورە، هەروەکوو فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ﴾[41] واتە: وریابە نەکەی لـەبێئاگایان بیت. بەڵێ ئەوکەسانەی کە خوایان لە بیرکرد ئەوە خوای گەورەش ئەوانی ئیهمال کرد و گوێی پێ نەدان، وەك بڵێی لە بیرە خۆی بباتەوە، لـەبەر ئەوەی ئەوان

[41] سورة الأعراف آية ٢٠٥

خێری دونیاو دوارۆژیان لە خۆیان حەڕام کرد، وە پشتیان لەو هەموو سەرکەوتن و خۆشبەختیەت کرد، کە بەهۆی زیکرو بەندایەتیەوە دەستیان ئەکەوت، لەبری ئەوە ڕوویان لە هەموو بەدبەختی و نائومێدیەك کرد و خۆیان سەرقاڵ کرد پێی.

"خۆشەویستان" ئەمانەش کۆمەڵێك ئاداب و ڕەوشتە پێویستە بەندە ڕەچاویان بکات، ئەویش زۆر زیکرکردنی خوای گەورەیە(ﷻ) لە شەو و ڕۆژدا، بە تایبەتی نێوان نوێژی بەیانی و خۆرهەڵات، وە نێوان مەغریب و عیشا، بە نیەتێکی پاك و بە دڵێکی پڕ ترس و خۆبەکەم زانین و ئەدەب و ویقارەوە دانیشەو ڕوو لە زیکرو پاڕانەوە بکە، وە بە ئامەدەبوونی دڵیشەوە نەك بێ ئاگابیت لێی، چونکە خۆشەویست ئەفەرموویێت: (أُدْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَجِيبُ دُعَاءٍ مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاَهٍ)[٤٢]، واتە: لە خوای گەورە بپاڕێنەوەو داوابکەن،

[٤٢] حەسەن و صەحیحە. ترمذي لە (سنن الترمذي)(ژ٣٤٧٩). وە تەبەڕانی لە(المعجم الأوسط). وە بەززار لە (مسند البزار) (ژ١٠٠٦١). وە حاکم لە (مستدرك)(ژ١٨١٧) هەموویان لە ئەبوو هورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە، وە لە سەنەدەکانیاندا صالحی موڕڕی تێدایە، حاکم ئەفەرموویێت: "ئەو فەرموودە سەنەدەکەی جێگیرە، سالحی موڕڕی تێدایە، کە یەکێکە لە زاهیدەکانی ئەهلی بەصرە تاکە لە گێڕانەوەی فەرموودەکە، وە شەیخەین فەرموودەیان لێ

وە یەقینیشتان هەبێت لە پاڕانەوەکاندا کەخوای گەورە(ﷻ) قەبوولی دەکاو وەڵامتان ئەداتەوە، ئاگادارین! خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەی دڵێك ناداتەوە کە بێ ئاگاو سەرقاڵ بێت).

---

اللَّهُمَّ" بِتَلأْلُؤِ نُورِ بَهَاءِ حُجُبِ عَرْشِكَ مِنْ أَعْدَائِنا احْتَجَبْنا، وَبِسَطْوَةِ الْجَبَرُوتِ مِمَّنْ يَكِيدُوننا اسْتَتَرْنا، وَبِطَوْلِ حَوْلِ شَدِيدِ قَوَّتِكَ مِنْ كُلِّ سُلْطَانٍ تَحَصَّنا، وَبِدَيْمُومِ قَيُّومِ دَوَامِ أَبَدِيَّتِكَ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ اسْتَعَذْنَا، وَبِمكْنُونِ السِّرِّ مِنْ سِرِّكَ مِنْ كُلِّ هَمٍّ وَغَمّ تَخَلَّصْنا، يَا حَامِلَ العَرْشِ عَنْ حَمَلَةِ الْعَرْشِ، يَا شَدِيدَ الْبَطْشِ، يَا حَابِسَ الْوَحْشِ، اِحْبِسْ عَنَّا مَنْ ظَلَمَنَا، وَاغْلِبْ مَنْ غَلَبَنا" ((كَتَبَ

---

تەخریج نەکردووە، وە زەهەبیش ئەفەرمووێت: "صالح مەترووکە". وە ئەلبانیش ئەفەرمووێت: "فەرموودەیەکی حەسەنە (صحیح الجامع الصغیر)(ژ٢٤٤) ، جا ترمذي ئەفەرمووێت: "فەرموودەیەکی غەریبە". وە شاهێدیش لەسەر ئەو ئەو فەرموودەیە ئیمام ئەحمەد لە (مسند)(ژ٦٦٥٥) لە ئیبن و عومەرەوە کە صالحی موڕڕی تێدا نیە ڕیوایەتی کردووە، ئیبن و حەجەری هەیثەمی ئەفەرمووێت: "ئەحمەد ڕیوایەتی کردووەو سەنەدەکەشی حەسەنە"،(المجمع الزوائد)(ب١٠/ل١٤٨/ژ١٧٢٠٣). بەڵام ئەحمەد مەحمود شاکر بەصەحیحی داناوە، وە عبدالله کوڕی موبارەك لە(الزهد)(ب٢/ل٢١)بەڕێگایەکی تر لە صەفوانی کوڕی سولەیمەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)ڕیوایەتی کردووە.

اللّٰهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللّٰهَ قَوِيٌّ عَزِيـزٌ)) اِحْتَجَبْنَـا بِنُـورِ اللهِ، وَبِنُورِ عَرْشِ اللهِ، وبِكُلِّ اسْمٍ للهِ، مِنْ عَدُوِّنا وَعَدُوِّ اللهِ، وَمِنْ شَـرِّ كُلِّ خَلْقِ اللهِ، بِمِائَةِ أَلْفِ أَلْفِ" لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلا باللهِ، وحَسْبُنا اللهُ وَنِعمَ الوَكِيل، وصـلّى اللهُ عَلـى سَـيِّدنا مُحمَّـد، وَعَلـى آلـهِ وَصَحْبِه وَسلَّم. آمينَ، والحمد لله ربّ العالمين.



**خزمەتکاری دین و ئوممەت**

شێخ عەباس فازڵ حەسەنی
عێراق-- سامەرا -- قەلعە

# ناوەڕۆك

# پەیامەکانی حەق و نوور
# ناو نیشانمان لە ئینتەرنێت




/https://www.facebook.com/tawhid.knowledge

**موقع التوحيد والمعرفة**

/http://www.tawhid-knowledge.com

عێراق / شاری سامەڕا / گەڕەکی قەلعە
مزگەوتی رباط

# موسڵمانی خۆشەویست



گەرانەوەی تۆ بۆ باوەشی دینەکەت زامنی بێ بەڵابوونت ئەکاٚت لەو فیتنانەی کە لەم نامیلکەیەدا هاتووە، بۆیە ژینی ئیمرۆکەت بە هەل بزانە نەوەکا هێرشی عەفلەت و مردن یەخەت پێ بگرێت و هیچت پێ نەکرێ، تەمەنەت بەخششێکە لە لایەن خواوە بۆیە بزانە چۆن ئەم لاویەت ئەبەخشی بۆ شتە دینی و دونیاییەکان.

پەیامەکانی حەق و نوور    دەرگایەک لە نوور

فیتنەکانی ڕۆژگار

2017    چاپی یەکەم